## پێش کەوتنی ئیمام لەنوێژدا بەئەنقەست

پەلەکردن یەکێکە لەڕەفتارو سروشتی مرۆڤ .

﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ عَجُولٗا ﴿١١﴾﴾ الإسراء: ١١.واتە « **مرۆڤ هەمیشە پەلەکارو هەڵەشەیە**».

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

« **التَّأَنِّي مِنَ اللهِ وَالْعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ**».

**واتە « نەرم ونیانی ولەسەر خۆی لە خوداوەیە، وە هەڵپە هەڵپ و پەلەکردن لە شەیتانەوەیە ».[1]**

ئەوی کە زۆر تێبینی دەکرێ لە نوێژی جەماعەتدا لە لای ڕاست و چەپەوە نوێژخوێنێکی زۆر دەبینرێ پێش ئیمام دەکەون، بەتایبەت لە ڕکوع وسوجدە بردندا، وەلە ((الله اکبر))ەکاندا بەگشتی، وەتەنانەت لەکاتی سەلام دانەوەش دا .

ئەم کارە هەرچەندە لەناو خەڵکدا گرنگی پێ نادرێ، بەڵام هەڕەشەی توندی دەربارەی هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ:

« **أَمَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ**».

**واتە: « ئایا ئەوکەسەی سەری لە پێش سەری ئیمامەوە بەرز دەکاتەوە ناترسێ خوای گەورە سەری بکات بەسەری گوێ درێژ »[1].**

---

(١)رواه البيهقي في السنن الكبرى ١٠/١٠٤ وهو في السلسلة ١٧٩٥.

نوێژخوێن پێویستە لەسەری کە بەهێمنیو لەسەر خۆییەوە بێت بەردو نوێژ، جا ئەمە ئەگەر بۆهاتنەکەی بێ، ئەی ئەبێ بۆنوێژەکە چۆن بێ

وە هەندێ خەڵکی تر مەسەلەکەیان وا لێ تێکەڵو پێکەڵ بووە، بۆئەوەی پێش ئیمام نەکەون کە چی زۆر لە ئیمام دوادەکەونو بەجێ دەمێنن

پێویستە بزانرێ کە شەرعناسان (بەرەحمەت بن) بنەمایەکی جوانیان باسکردووەو دانـاوە بۆ ئەوەی نوێژ خوێن نە پێش ئیمام بکەوێو نە لە ئیمامیش جێ بمێنێ، ئەویش ئەوەیە: کاتێك کە ئیمام «**الله أكبر**» ی تەواوکرد ئینجا نوێژخوێن بجوڵێ، کەواتە هەرکات ئیمام لە ووشەی (راء) ی «**الله أكبر**» تەواوبوو ئینجا دروستە بۆ نوێژ خوێن بجوڵێو حەرەکەبکات. نە پێش ئەوە بکەوێ نە دواش بکەوێ .بۆیە بەم شێوەیە کارەکەرێك دەخرێ

وە هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی کە پێشی پێغەمبەر ﷺ نەکەون، گرنگیان بەو کارە زۆر دەدا.

بۆ نمونە یەکێك لەوان کە (براء) ی کوڕی (عازب)ە دەفەرموێ : صەحابە لە پشتی پێغەمبەردوە نوێژیان دەکرد، کاتێك کە پێغەمبەرﷺ سەری لە رکوع بەرز بکردایەتەوە بڕۆشتایە بەرەو سوجدە کەس نەدەبینرا بچەمێتەوە بەرەو سوجدە هەتاوەکو پێغەمبەرﷺ ناوچەوانی دانەنایە لەسەر زەوی، پاشان هەمووی لە دواوە لار دەبونەوەو بەردو سوجدە دەچەمینەوە.

وە کاتێك پێغەمبەرﷺ کەوتەتەمەنەوەو حەرەکەو جموجۆڵی جۆرێك لە خاوبونەوەی تێکەوت، نوێژخوێنانی پشتەوەی ئاگادار کردەوە فەرمووی

---

(١)رواه مسلم ١/٣٢٠-٣٢١

« أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي قَدْ بَدَّنْتُ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ».

واتــە « ئــەی خەڵکینــە مــن کەوتومەتــە تەمەنــەوەو قــورس بــووم، بۆیــە وریــابن لە نوێژدا پەلەمەکەن و پێشم نەکەون لە ڕکوع وسوجدە بردندا».[1]

وە پێویـسـتە ئەوکەسـەی کـە ئیمـام و پـێش نوێـژە، کاتێـک کـە نوێـژ دەکـات وتنـی(الله اکـبر)ەکـانی بـەگوێرەی سـوننەتی پێغەمبـەر بـێ، بـەو شـێوەیەی کەلـە (حدیث)ەکەی(أبوهريرة) دا هاتوەو دەفەرمووێ :

« كَانَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَـامَ إِلَـى الـصَّلَاة يُكَبِّـرُ حِـينَ يَقُومُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ ثُمَّ يَقُولُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَـعُ صُـلْبَهُ مِـنْ الرُّكُوعِ ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِـينَ يَهْـوِي سَـاجِدًا ثُـمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَـهُ ثُـمَّ يَفْعَـلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الصَّلَاة كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا وَيُكَبِّرُ حِـينَ يَقُـومُ مِـنْ الْمَثْنَـى بَعْـدَ الْجُلُوسِ».

واتــە « پێغەمبــەر ﷺ هــەرکات هەســتایە بۆنوێــژ، «الله أكــبر» ی دەکــرد کاتێـک نوێـژی دابەسـتایە، پاشـان «الله أكــبر» دەکـرد کاتێـک ڕکـوعی ببردایـە، پاشـان لـە ڕکـوع بـەرز دەبویـەوەو دەیفـەرموو: « سَــمِعَ اللَّــهُ لِمَــنْ حَمِــدَهُ » وەکاتێـک تـەواو ڕاسـت دەبوویـەوە دەیفـەرموو« رَبَّنَــا وَلَــكَ الْحَمْــدُ » ، پاشـان «الله أكــبر»ی دەکـرد کاتێـک دابەزایـە بۆسـوجدە، پاشـان «الله أكــبر» ی دەکـرد کاتێـک سـەری بـەرز بکردایەتـەوە، پاشـان «الله أكــبر» ی دەکـرد کاتێـک سـوجدەی ببردایـە، پاشـان «الله أكــبر» دەکـرد کـە سـەری بـەرز بکردایـە، ئینجـا ئەمـەی

(١)رواه البيهقي ٢/٩٣ وحسنه في إرواء الغليل ٢/ ٢٩٠

**بەردەوام دەكرد لە هەموو نوێژەكەی دا تاوەكو تەواو دەبوو. وەكاتێكیش لە دوای دانیشتنی یەكەم هەڵبسایەتەوە «الله أكبر» دەكرد ».**[1]

جا بۆیە هەركات پێش نوێژ «الله أكـبر» ەكانی كۆكو تەبابوون لەگەڵ جوڵەو حەرەكەكەی، وەنوێژ خوێنەكانیش بەو چۆنیەتیەی كە باسكراوە جوڵانەوە، ئەوا كاروباری نوێژی جامەعەتەكەی رێك وپێكو باش دەبێ.

## هاتنی كەسێك بۆمزگەوت كەسیر وپیازی خواردبێ ،یان بۆنێكی ناخۆشی پێوەبێ

خوای گەورە دەفەرموێ :-

﴿ ۞ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴾ الأعراف: ٣١.

**واتە « ئەی نەوەكانی ئادەم هەركە دەچنە مزگەوت بۆنوێژ، جل وبەرگی پاك وخاوێن بپۆشن».**

لە«**جابر**»كوڕی«**عبدالله**»ەوە دەفەرمووێ، پێغەمبەرﷺ فەموویەتی:

**« مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا أَوْ قَالَ فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ».**

**واتە « هەركەس سیرو پیازی خوارد بالێمان دوركەوێتەوە، یان فەرمووی: با لە مزگەوتمان دوركەوێتەوە ولەماڵەكەی خۆیدا بمێنێتەوە »**[2]

(١)رواه البخاري رقم ٧٥٦ ط. البغا

(٢) رواه البخاري انظر الفتح ٢/٣٣٩

وە لە ڕیوایەتەکەی «مسلم»داهاتوە:

« مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ وَالثُّومَ وَالْكُرَّاثَ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدَمَ».

واتە « هەرکەس پیازو سیر و کەوەری خوارد با نزیکی مزگەوتمان نەکەوێ، چونکە ملائیکە توشی ئازار دەبن بەو شتانەی کە مرۆڤ پێ ئازارمەند دەبێ »[1].

وە «عمـر»ی کوڕی «خطـاب»وتاری دەخوێنند لە ڕۆژی جومعەدا، لەناو وتارەکەیدا فەرمووی:

« ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ لَا أَرَاهُمَا إِلَّا خَبِيثَتَيْنِ هَذَا الْبَصَلَ وَالثُّومَ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا وَجَدَ رِيحَهُمَا مِنْ الرَّجُلِ فِي الْمَسْجِدِ أَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ إِلَى الْبَقِيعِ فَمَنْ أَكَلَهُمَا فَلْيُمِتْهُمَا طَبْخًا».

واتە « ئەی خەڵكینە ئێوە ئەم دوو ڕووەکە دەخۆن‌و من بە پیسیان دەبینم: کە ئەویش سیرو پیازە، دڵنیابن پێغەمبەرم ﷺ دەبینی هەرکات لە مزگەوتدا بۆنی ئەو دوانەی لە هەر پیاوێك بکردایە ، ئەوا فەرمانی پێ دەکرد کە دەربچێ لە مزگەوت‌و دورکەوێتەوە بەرەو بەقیع، جا هەر کەس سیرو پیازی خوارد با جوان لە چێشتدا سوری بکاتەوەو بۆنەکەی بمرێنێ».[2]

---

(١)رواه مسلم رواه ١/٣٩٥

(٢)رواه مسلم ١/٣٩٦

وە ئـەوەی پەیوەنـدی بـەم باسـەوە هەیـە: ئـەو کەسـانەش دەگرێتـەوە کـە ڕاسـتەوخۆ لـە دوای ئـیش کـردن دەچـنە مزگەوتـەوە بـە بـۆنی ناخۆشـی عـەرەقی بـن باڵوگۆرەویەکانیانەوە .

لـەوەش خـراپ تـر جگـەرە خۆرەکـانن، ئەوانـەی کـە جگـەرەی حـەرام دەکێـشنو پاشـان دەچـنە مزگەوتەکانـەوەو ئـازاری بەنـدەکانی خـوا دەدەن لـە ملائکـەو نوێـژ خوێنان.

## زینـــــاکردن

یـەکێك لەمەبەسـتو ئامانجـەکانی شـەریعەتی ئیـسلام پاراسـتنی نـاموسو وەچەو نەسەبی خەڵکی یە، بۆیە زینای حەرام کردووە .

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ :-

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الإسراء: ٣٢

**واتـە « وریـابن بـەهیچ شـێوەیەك تـوخنی زینـا نەکـەون، چـونکە بەڕاسـتی زینـاو داوێـن پیـسی تاوانوکردەوەیـەکی زۆر خراپـەو ڕێگایـەکی زۆر ناپەسـەندو قێزەونە ».**

شـەریعەتی پـیرۆزی ئیـسلام نـەك هـەر زینـای حـەرام کـردووە، بـەڵکو هـەموو ئـەوکونو کەلەبـەرو ڕیگـاو ڕێـچکانەشی داخـستووە کـە مـرۆڤ پـەلکێش دەکـەن بـەرەو زینـا، لەوانـەش فـەرمانی کـردووە بـە داپۆشـینی ئافرەتـانو، فـەرمانی

كردووە بە پاراستنی چاو لە تێڕوانینی حەرام‌و تاك بونەوەی پیاوو ئافرەت‌و زۆر شتی تریشی لەو پێناوەدا حەرام كردووە.

پیاوی زیناكاری خێزاندارو ئافرەتی زیناكاری مێرددار، تۆڵەی لێ دەسێنرێتەوە بە ترسناكترین‌و قورس ترین سزا، ئەویش بریتی یە لە بەردە باران كردنی تا دەمرێت، تا تۆڵەی گوناهەكەی بچێژێت ، بۆئەوەی هەموو لاشەی ئازار بچێژێت، وەك چۆن گشت لاشەی تێركردووە لە حەرام .

وە پیاوی زیناكارو ئافرەتی زیناكار گەر هاوسەردار نەبوون بە ڕێگایەكی شەرعی، ئەوا تۆڵەی لێ دەسێنرێتەوە بە فەلاقەكردن وجەڵدە لێدان ، كە لەسنورە شەرعیەكاندا دیاری كراوە ئەویش بریتیە لە(١٠٠) جەڵدە .لەگەڵ ئەوەش دا كۆمەڵێك لە بڕواداران ئامادەبن لەكاتی جەڵدە لێدانەكەی تاوەكو شەرمەزارو ناشیرین بێ لە ناو خەڵكدا، وە دەبێت لەشارەكەی خۆی دوربخرێتەودو دوچاری غەریبی بێ بۆماوەیساڵێك تاوەكو سوكی خۆی بۆ دەركەوێ .

وە سزای پیاوو ئافرەتی زیناكار لە بەرزەخدا: ئەوەیە بەڕوتی دەخرێنە ناو تەنورێكەوە كە سەرەوەی تەسكەو خوارەوەی فراوانەو لەخوارەوەش ئاگر دەدرێ، جا هەركات ئاگرەكە بڵێسەبدات‌و زیاد بكات هاواردەكەن‌و دەقیژێنن‌و بەرزدەبنەوە، هەتاوەكو نزیكی دەرچون دەبنەوە، بەڵام بڵێسەی ئاگرەكە دانەبەزێت‌و ئەوانیش دەگەڕێنەوە بۆناو تەنورەكە ، ئابەم شێوازە سزادەدرێن تا ڕۆژی قیامەت .

لەمەش ناشیرین‌و ناقۆلاتر ئەوەیە پیاو لەگەڵ ئەوەی تەمەنی گەورە بوویێ‌و لەمردن نزیك بوویێتەوەو چوبێتە ساڵەوەو خوداش ئەوەندە مۆڵەتی دابێ و تەوبەی نەكات‌و هەر بەردەوام بێ لەسەر زینا.

كەوابوو ناشرینترن‌و چەپەڵترین زیناكار ئەو كەسەیە كە چووبێتە ساڵەوەو تەمەنی گەورەبێ‌و زینا بكات.

لە«**أبوهريرة**»ەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێ:

**« ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ القِيَامَةِ ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ : شَيْخٌ زَانٍ ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ».**

**واتە « سێ كۆمەڵە خەڵك خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا ناكات‌و لەگوناه پاكیان ناكاتەوەو، بە چاوی رەحمەت تەماشایان ناكات‌و، سزایەكی سەختیشی بۆ داناون ، پیاوێكی بە تەمەنی زیناكار، پاشایەكی درۆزن، هەژارێكی خۆ بەزلزان »**[1].

وەخراپترین‌و پیسترین كاسبی ئەو پارەیەیە كە بەرامبەر زینا وەردەگیرێ. وە ئەو ئافرەتەی بەهۆی داوێن پیسی یەوە كاسبی بكات‌و بژێوی پەیدابكات، بێبەش‌و مەحرومە لە قەبوڵ بوونی دوعاو پاڕانەوە، كاتێك كە لە نیوەشەودا دەرگاكانی ئاسمان دەكرێتەوە (بۆ قبوڵ بوونی دوعاوپاڕانەوە )[2].

---

(١)رواه مسلم ١/١٠٢-١٠٣

(٢)الحديث في صحيح الجامع ٢٩٧١

وە هەرگیز فەقیریو هەژاری بیانوی شەرعی نین بۆ شكاندن سنوروكانی خوای گەورەو ئەتككردنی ناموسی یەكتر، وەكو پێشینان وتویانە : برسیبەو سەربەرزبە، وە بەهۆی شیری مەمكی خۆتەوە نەلەوەڕێی.

وە لەم چەرخەدا هەموو دەرگاكان خراونەتە سەر پشت بۆ ئەنجام دانی كاری خراپ، وە شەیتان گشت ڕێگاو ڕێچكەكانی خراپەكاری ئاسان كردووە بە هۆی فرِوفێڵەكانی خۆیو دۆستەكانی، وە كەسانی تاوانبارو خراپەكار شوێنی تەڵەكانی شەیتان كەوتوونو بوونەتە دەسكەلای دەستی شەیتان بۆ بلاْوكردنەوەی فەسادو بێ ئەخلاقی ، ئەویش بە بلاْوبونەوەی سفوریو خۆدەرخستن و خۆجوان كردنی ئافرەتان، وە بەرەلاْكردنی چاوو تێڕوانینی حەرامو، بلاْوبونەوەی تێكەڵی پیاوو ئافرەتو، گۆڤاری خراپو فلیمی نابەجێو ناپەسەندو، گەشتو گوزاری زۆر بۆ ولاْتو جێگای بەدڕەوشتانو، دروستكردنی بازاڕی تیجاری بۆ داوێن پیسیو بێ ئابڕویو، زۆربوونی هەتككردنی ناموسو، زۆر بوونی منداڵی حەرامو‌كوشتنی گۆرپەلەی بێ تاوان

خودایە داوات لێ دەكەین بەڕەحمەتو لوتفو پارێزگاری خۆت بمانپارێزی لە داوێن پیسیو، داوات لێ دەكەین دڵەكانمان پاك بكەیتەوەو داوێنمان پاك ڕابگریو، لەنێوان ئێمەو حەرام دا بەربەستێكی گەورە دروستبكەی.

## نێربازی

تاوانەکەی قەومی «لـــوط» ئەوەبوو لەگەڵ نێرینەکاندا جووت دەبوونو نێربازیان دەکرد.

وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :-

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ الأعراف: ٨٠

**واتە «(لـوط) مان عليه السلام كردە پێغەمبەرو بەگەلەکەی خۆی ووت: بەڕاستی ئێوە تاوانێکی خراپ و ناشرینی وا ئەنجام دەدەن لەڕووی داوێن پیسیوە کە هیچ کەسێك لە خەڵکانی جیهان پێش ئێوە کاری وەها شەرمەزارانەی نەکردووە، ئەویش ئەوەیە ئێوە دەچنە لای پیاوان و نێربازی دەکەن ».**

وە لەبەر ناشیرینیو ناقۆڵاییو ترسناکی ئەم تاوانو خراپەیە خوای پەروەردگار سزای ئەوکەسانەی داوە کە ئەنجامی دەدەن بە چوارجۆر لە سزاو تۆڵە، کە ئەم چوارجۆرە بەسەر هیچ گەلێکی تردا کۆنەبۆتەوە، ئەوانیش بریتین لە کوێر بوونی چاوەکانیانو، ژێروبان بوونیانو، بەردەباران کردنیان لەئاسمانەوە بەبەردی سورەوەبوو، وە ناردنی هاوارو قیژەیەکی سامناك بەسەریاندا.

وە لەشەریعەتی ئیسلامیش دا هەر کەسێك ئەو کارە ئەنجام بدات یان ئەو کارەی لەسەر بکرێ بەڕازی بوونی خۆیو زۆری لێ نەکرابێ ، ئەوا تۆڵەو سزاکەیان ئەوەیە کەدەبێ بە شمشێر بکوژرێن.

«عبــــدالله»ی کــوڕی«عبــــاس» لــە پێغەمبــەرەوەﷺ دەیگێڕێتــەوە کــە فەرموویەتی:

« مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ».

**واتە«هەرکسێکتان بینی کاری قەومەکەی «لوط»ی دەکرد (واتە نێربازی، ئەوا هەردووکیان بکوژن، ئەوەی کارەکە دەکاتو ئەوەش وا کارەکەی لەسەر دەکرێ ».**(١)

وە ئــەو نەخۆشــیو تاعونانــەی کــە ئــەمڕۆ لــەم ســەردەمەدا دەرکــەوتوونو لــە ســەردەمانی پێــشوودا نــەبوون، هــەمووی هۆکــاری داوێــن پیــسیە، وەکــو نەخۆشــی ئایــدزی کوشــندە .ئەمانــە هــەمووی بەڵگــەن لەســەر کارلــەجێی شــەریعەت کــە ئــەو جۆرە سزاو تۆڵانەی داناوە.

## نەهاتنی ئافرەت بۆسەر جێی پیاوەکەی بەبێ هیچ عوزرێکی شەرعی

«أبوهريرة» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

« إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ».

**واتــە: «هــەرکات پیــاو داوای ســەرجێی لــە خێزانەکــەی کــردو ئــەویش پــشتی تێکــردو وەڵامــی نەدایــەوە، وە ئــەو پیــاوە ئــەو شــەوە بــە تــوڕەیی ســەر بنێتــەوە بەرامبــەر بــە خێزانــی، ئــەوا (مەلائیکــە) لەعنــەت لــەو ئافرەتــە دەکــەن تــا بــەیانی ».**(٢)

---

(١)رواه الإمام أحمد ٣٠٠/١ وهو في صحيح الجامع ٦٥٦٥

(٢)رواه البخاري انظر الفتح ٣١٤/٦

زۆرێـك لـە ئافرەتـان كاتێـك كێـشەیەك لـە نێـوان خـۆیو مێردەكەیـدا دروسـت دەبـێ، بـە گومـانی خـۆی دەیـەوێ تۆڵـەی خـۆی بكاتـەوە، بۆیـە خـۆی دەگرێتـەوە لەسـەر جێـی كـردن لەگـەڵ پیاوەكـەی، جـا ئـەم كـارەی كـە ئافرەتـان دەیكـەن مەفـسەدەو خراپـەی زۆری لـێ دەكەوێتـەوە، لەوانـە پـێ دەچـێ پیاوەكـەی بكەوێتـە حەرامـەوەو، زۆرجـار لەوانـە ئیـشەكە بـە خـراپتر بەسـەر ئافرەتەكـەدا بـشكێتەوە، كە پیاوەكەی بیر لە خێزانێكی تر بكاتەوەو بەسەر ئەم دابیهێنێ

وە پێویـستە لەسـەر ئـافرەت گـورج بـێ لـە وەڵام دانـەوەی داواكـاری مێردەكـەی هـەركات داوای لـێ كـرد، تـاوەكو ئـەم فـەرمانی پێغەمبـەر ﷺ جێبـەجێ بكـات كە دەفەرمووێ:

« إذا دعا الرجلُ امرأته إلى فراشه فلتُجِبْ وإن كانتْ على ظهرِ قَتَبٍ».

**واتـە: « هـەركات پیـاو داوای سەر جێـی لـە خێزانەكـەی كـرد، ئـەوا بـا دەسـت بـەجێ وەڵـامی بداتەوە،تەنانـەت ئەگـەر لەسـەر كـۆچ و بـاری حوشترەكەشـی بـێ بـا دابەزێ »**[1]

وە پێویستیـشە لەسـەر پیـاو بەتـەنگ خێزانیـەوەی بـێو ڕەچـاوی حـاڵی خێزانـی بكـات، كاتێـك نەخۆشـە یـان دووگیانـە یـان بـێ تاقەتـەو خەفـەتبارو دڵتەنگـە، بۆئـەوەی كـۆكو تـەبایی و خۆشەویـستیان بـەردەوام بـێو دژایـەتیو تـێگیران لەنێوانیان دروست نەبێ

(١)انظر زوائد البزار ٢/١٨١ وهو في صحيح الجامع ٥٤٧

## داوای ئافرەت بۆتەڵاق لەمێردەکەی بەبێ هیچ هۆیەکی شەرعی

زۆریـــك لــە ئافرەتــان پەلەوهەڵەشــەن لــە داواکردنــی تــەڵاق لــە مێردەکانیــانو مێرد ناچار دەکەن کە خێزانیان بە تەڵاق دان بدەن .

بۆ نمونـە کاتێـك کێـشەیەکی بـچوك دروسـت دەبـێ، یـان کاتێـك ئـەو پـارەو ماڵـەی کـە دەیـەوێ پیاوەکـەی پـێ ی نـەداو بـۆی دابـین نـەکات، ئـەوا دەسـت بـەجێ داوای تـەڵاق دەکـات. وە زۆرجـار پـێ دەچـێ لـە لایـەن کەسـوکاری ئافرەتەکـەوە هانبـدرێ و پاڵی پێوەنبرێ .

وە زۆرجــار ئــافرەت لــە ڕووی پیــاودا دەوەســتێو بەرامبــەری لــێ دەگــرێو لێـی ڕاسـت دەبێتـەوە بـە کۆمـەڵێك ووتـەو قـسەی کاریگـەرو هەسـتیار کـە دەمـاری پیاو دەگرێو توڕەی دەکات وەکو دەڵێ ئەگەر پیاوی تەڵاقم بدە.

وە شـتێکی زانـراوە کـە تـەڵاقو جیابونـەوەو لێکـدابڕانی پیـاو وئـافرەت بـەڵاو نەگبــەتی زۆری لێ دەکەوێتــەوە، شــیرازەی خێــزان دەپــچڕێو ئــەتك دەبــێو، وە منــداڵ پەرتــەوازەو بــێ ســەروبەر دەبــێ، وە زۆر جــار پەشــیمانی لــەدوادێ، بــەڵام پەشیمانی سودێك نابەخشێ .

ئــا ئەمانــەو چــەندەهای تــریش حیکمــەتو کــار لــەجێی شــەرع دەردەخــات، کاتێك کە داواکردنی تەڵاقی حەرام کردووە.

«**ثوبان**» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

« **أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا الطَّلَاقَ مِنْ غَيْرِ مَـا بَـأْسٍ فَحَـرَامٌ عَلَيْهَـا رَائِحَـةُ الْجَنَّةِ**».

**واتــە: « هــەر ئافرەتێــك داواى تــەڵاق لــە مێردەكــەى خــۆى بكــات بــەبێ بیانویەكی شەرعی، ئەوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە »[1].**

**«عقبة»ى كوڕى«عامر» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:**

**« إنَّ الْمُخْتَلعَاتِ الْمُنْتَزِعَاتِ هُنَّ الْمُنَافقَاتُ».**

**واتــە: « ئــەو ئافرەتانــەى داواى (خلــع) جیابونــەوە دەكــەن بــەبێ بیــانوی شەرعی ئەوانە مونافقن»[2].**

بــەڵام ئەگــەر هۆكــارێكی شــەرعی هــەبوو بــۆ ئــەوەى ئافرەتەكــە داواى تــەڵاق‌و جیابونــەوەبكات، وەكــو ئــەوەى پیاوەكــەى وازى لــە نوێــژ هێنــابێ، یــان عــارەق خــۆربێ، یــان بیــەوێ بــە زۆر خێزانەكــەى توشــی كــارى حــەرام بكــات، یــان زوڵــم‌و ستەمی لــێ بكــات بــە لێدان‌و ئــازاردان یــان ئافرەتەكــە لەمافــە شــەرعیەكانی خــۆى بێبــەش بكــات، وە نەســیحەت‌و ئامۆژگــاریش ســودى نــەبوو، وە هــیچ ڕێگەیــەك نەئــەبینرا بــۆ چــاك بــوونی، ئــەوا ئافرەتەكــە هــیچ تــاوانی لەســەر نــی یــەو گوناهبــار نــابێ كــە داواى تــەڵاق لــە مێردەكــەى بكــات، بــۆ ئــەوى خــۆى‌و دینەكــەى ســەلامەت بێ‌و دوچارى تاوان‌و خراپە نەبێ .

(١)رواه أحمد ٢٧٧/٥ وهو في صحيح الجامع ٢٧٠٣

(٢)رواه الطبراني في الكبير ٣٣٩/١٧ وهو في صحيح الجامع ١٩٣٤

## شوبهاندنی خێزان بەدایك و خوشك (الظِهار)

«ظهار» یەکێکە لەو ووتەو دەربڕینانەی سەردەمی نەفامی کە ئەمڕۆ پەیڕەو دەکرێ‌و لەناو موسڵمانانادا بڵاوە، وەکو ئەوەی پیاو بە خێزانی خۆی بڵێ‌« تۆ وەکو دایکم وای، یان تۆحەرام بی لەسەرم وەکو چۆن دایکم لێم حەرامە » .

ئەم ووشەو دەربڕینە ناشرینانەو هاوشێوەی ئەمانەن شەریعەت بە قێزەون‌و نابوتی داناوە، چونکە زوڵم‌و ستەمی تێدادەردەکەوێ بەرامبەر بە ئافرەت.

وەخوای گەورە ئەم کارەی بەوە وەصف کردووە کە دەفەرمووێ :

﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٢﴾ ﴾ المجادلة: ٢

**واتە: « ئەوانەتان لە خێزانەکانیان «ظهـار»ئەکەن و پێیان دەڵێن: ئێوە وەکو دایکمانن، ئەوان دایکیان نین، دایکی ئەوان ئەو ئافرەتانەن کە ئەوانیان لێ بووە، وە بەڕاستی ئەوەی بە خێزانەکەی خۆی بڵێ (وەکو دایکم وای) ئەوە قسەیەکی نابەجێ و درۆیەکی ناپەسەندی کردووە ».**

وە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام کە فارەتێکی قورسی بۆئەو حاڵەتە داناوە، کەفارەتەکەی وەکو کەفارەتی کوشتنی کەسێکە بەهەڵە، هاوشێوەی کەفارەتی جووت بوونە لەگەڵ خێزان لە مانگی ڕەمەزاندا .

جابۆیە ئەو کەسەی «ظهـار» لە خێزانەکەی بکات‌و ئەو قسانەی بەرامبەر بکات، نابێت نزیکی خێزانی بکەوێ تاوەکو کەفارەت‌و باجەکەی دەدات .

خوداش خۆی باسی کەفارەتەکەی کردووەو دەفەرموێ :

﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ المجادلة: ٣ – ٤ .

**واتـە: « ئەوانـەی لەخێزانـەکانیان «ظهـار» ئەکـەن، لـە پاشـان دەگەڕێنـەوەو پەشـیمان دەبنـەوە لەقسـەی خۆیـانو دەیانـەوەی بیانکەنـەوە بـە خێزانـی خۆیـان، ئەوە پێش ئەوەی بـچنە لایـان دەبـێ یـەکێك لـەم سـێ شـتە بکـەن بـۆ ئـەوەی ببێتـە کەفارەتی کارەکەیان»:**

**یەکەم:**

﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ﴾ المجادلة: ٣.

**واتـە: « بەندەیـەك ئـازاد بکـەن، پـێش ئـەوەی بگـەن بەیـەك و تێکـەڵی ژن ومێردی بکەن».**

**دووەم:**

﴿ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ﴾ المجادلة: ٤

**واتـە: « ئەگـەر ئـەو کەسـە کۆیلـەی دەسـت نەکـەوت ئـازادی بکـات، ئـەوا دەبـێ دوو مـانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ . بەرلەوەی بگەن بەیەك ».**

**سێیەم:**

﴿ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ﴾ المجادلة: ٤

**واتـە: « جائـەوەی نـەیتوانی دوومـانگ بـەڕۆژوو بـێ، بـا شەسـت هـەژار لـە ژەمێك خواردن تێربكات».**

## جوتبوون لەگەڵ خێزان لەكاتی بێنوێژی دا

خوای گەورە دەفەرمووێ :

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾البقرة: ٢٢٢

**واتـە: « ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەبارەت بـەجووت بـوون لەگـەڵ ئـافرەتی حـەیزدار پرسـیارت لـێ دەكـەن، تـۆش بڵـێ : جـوت بـوون لەگـەڵ خێزانـدا لـەكاتی بێنوێـژی دا مایـەی زەرەرو زیانـە، بۆیـە لـە مـاوەی بێنوێژیانـدا لێیـان دوورـن‌و تێكـەڵی سـەرجێی ژن‌و مێردیـان لەگـەڵ مەكـەن‌و، نـابێ بـە مەبەسـتی سـەرجێ نزیكیان بكەن‌و بچنەلایان هەتاوەكو پاك دەبنەوەو خۆیان دەشۆن ».**

كـەوابوو دروسـت نـی یـە بـۆ پیـاو سـەرجێی لەگـەڵ خێزانـی خۆیـدا بكـات تاوەكو خۆی دەشوات لە دوای پاك بوونەوەكەی.وەكو خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴾البقرة: ٢٢٢

**واتـە: « هـەركات پـاك بوونـەوەو خۆیـان شوشـت، ئـەوجا بۆتـان هەیـەو دروسـتە بۆتـان بـچنە لایـان‌و سـەرجێیان لەگـەڵ بكـەن لـەو شـوێنەوەی كـە خـودا ڕێـی پـێ داون كە پێشەوەیە ».**

وە ئەوەی كە ناپەسەندی‌و قێزەونی ئەم تاوانە دەردەخات فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموی:

**« مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوْ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»** واتە: **« هەركەس بچێتە لای ئافرەتێكی حەیزدار یان لە دواوە بچێتە لای یان بچێت بۆلای فاڵچیەك، ئەوە كافر دەبێ بەو قورئانەی بۆ محمد ﷺ دابەزیوە »**[1].

وە هەركەس ئەم كارەبكات بەهەڵەو بەبێ قەسدو نەزانێ، ئەوا هیچی لەسەر نی یە. بەڵام هەركەس ئەم كارەبكات بە ئەنقەستو بشزانێ خێزانی لە بێنوێژی دایە، ئەوا كەفارەتی دەكەوێتە سەرو دەبێ باجەكەی بدات، لەسەر بۆچوونی هەندێ لەو زانایانەی كە«حدیث»ی كەفارەتەكەی بە«صحیح»دەزانن.

كەفارەتەكەشی بریتیە: لە دینارێك، یان نیو دینار « ئاڵتون».

جا هەندێ لە زانایان فەرموویانە: ئەو كەسە خۆی سەرپشكە لەوەی دینارێك دەدات یان نیو دینار .

وە هەندێكی تریان فەرموویانە: گەر پیاوەكە لەسەرەتای كاتی بێنوێژیەكەدا چووە لای خێزانی كە خوێنی زۆری لێ دێ، ئەوە دەبێت دینارێك بدات، وە ئەگەر لەكۆتایی كاتی بێنوێژیەكەدا چووە لای كە خوێنەكەی كەمە یان پێش خۆشۆردن بچێتە لای ئەوە نیو دینار دەدا.

---

(١)رواه الترمذي عن أبي هريرة ١/٢٤وهو في صحيح الجامع ٥٩١٨

وە دینارەکەش بە ئەندازەی ئیستا ٤,٢٥غرام ئاڵتوون، کە مسقاڵێك ئاڵتوونی عیارە(٢٤)ە، کە پێویستە بیکاتە خێر، یان نرخی ئەو ئاڵتوونە بە پارە دەرکات.

## جووتبون لەگەڵ دواوەی خێزان

هەندێ کەسی شازو نامۆو ڕەوشتو ئەخلاق شێواو بەهۆی لاوازی باوەڕو ئیمانیانەوە گوێ بەوە نادەن لە کوێوە لەگەڵ خێزانی خۆیان جووت دەبن، بۆیە سڵ ناکەنەوە لەوەی لەگەڵ دواوەی خێزانیان جووت دەبنو خۆیانی لێ ناپارێزن.

جووت بوون لەگەڵ ئافرەت لەکۆمەوە یەکێکە لەگوناهە گەورەکان.

«أبوهريرة» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

« مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا».

**واتە: « مەلعونەو بەرلەعنەت کەوتووە، ئەو کەسەی بچێتە لای ئافرەت لەکۆمەوە»[1].**

نەك هەرئەمە بەڵکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

**«مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوْ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ».**

---

(١)رواه الإمام أحمد ٤٧٩/٢ وهو في صحيح الجامع ٥٨٦٥

**واتــە: « هەركــەس بــچێتە لای ئــافرەتێكی حــەیزدار یــان لــەدواوە بــچێتە لای یــان بــچێت بــۆلای فالــچیەك، ئــەوە كــافر دەبــێ بــەو قورئانــەی بــۆ محمد ﷺدابەزیوە »**[1].

وە زۆر ئــافرەتی خــاوەن سروشــتو تەبیعــەت پــاك لــەم كــارە پــشتیان هــەڵكردووەو وەڵامــی مێردیــان نەداوەتــەوە هەرچــەندە زۆریــان لــێ كــراوەو تــەنگیان پــێ هەڵــچنراوە، تەنانــەت لەلایــەن هەنــدێ مێــردەوە هەڕەشــەی تــەڵاق كــراوە ئەگــەر خێزانەكەی بەقسەی نەكات .

وە هەنــدێ لــەو ئافرەتانــەی كــە شــەرم دەكــەن پرســیار لــە زانایــان بكــەن ســەبارەت بــەم كــارە، مێردەكانیــان گومــانو دوودڵــی وایــان بــۆ دروســت دەكــەن كــە ئــەو كــارە حەڵاڵــە ئــەو ئایەتــە بــۆ خێزانــەكانیان دەكەنــە بەڵگــە كــە خــودا دەفەرمووێ :

﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾البقرة: ٢٢٣

**واتــە: « خێزانــەكانتان كێلگــەن بــۆ ئێــوە، كــەوابوو بەهــەر شــێوەیەك پێتــان خۆشــە بــچنە لایــانو لەگــەڵیان جــووت بــن، بەمــەرجێك لــە شــوێنی شــەرعیەوە بێ»**.

وەشــتێكی زانرایــشە كــە« ســوننەت » ڕوونكــەرەوەی مانــاو مەبەســتەكانی قورئانە .

---

(١)رواه الترمذي برقم ١/٢٤٣ وهو في صحيح الجامع ٥٩١٨

جا لە سوننەتدا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری كردووین دروستە چونەلای ئافرەت و سەرجێی لەگەڵ كردنی بەهەر شێوەیەك كە خۆی ئارەزووی لێی بێ لە پێشەوە بێ یان لەدواوە بێ، بەڵام بەمەرجێك جووتبوونەكە لە شوێنی منداڵ بوونەوە بێ. وە شاراوەش نی یە كە كۆم جێگای پیسەیە نەك شوێنی منداڵ بوون .

وە شتێكی زانراوە بەڵگە نەویستیشە كە ئەم كارە حەرام و قەدەغەكراوە تەنانەت ئەگەر هەردوولا پێی قایل بن و پەسەندیشی بكەن، چونكە ڕازی بوون لەسەر حەرام حەرامەكە حەڵاڵ ناكات .

## دادپەروەر نەبوونی مێرد لەنێون خێزانەكانیدا

لەو شتانەی كە خوا لە قورئانەكەی دا فەرمانی پێ كردووەو ئامۆژگاری كردووین، دادپەروەری مێردە لە نێوان خێزانەكانیدا.

﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ ﴾ النساء: ١٢٩

واتە: « هەرگیز ناتوانن لە خۆشەویستی نێو دڵتان دا دادپەروەربن لە نێوان خێزانەكانتان دا، هەرچەندە هەوڵیش بدەن، جا كەوابوو: بەتەواوی خوارمەبنەوە لە یەكێك لە هاوسەرەكانتان، بەو هۆیەوە وازبهێنن لەوی تریان وەك هەڵبەستراوی لێ بكەن نە ئەوەیە مێردی هەبێ، نە ئەوەشە ئازادكرابێ،

**جا ئەگەر لەگەڵیان چاك بن و خۆتان لە ناعەدالەتی ڕواڵەتی بپارێزن، ئەوا خوداش لێبوردە و بەرەحم و میهرەبانە ئەوەی نێو دڵتان لێ ناگرێ».**

ئەو دادپەروەرییەی کە شەرع داوای کردووە لە نێوان خێزانەکاندا ڕەچاو بکرێ و بپارێزێ بریتیە لە ماڵ و خانوو جێگای نوستن و، هەریەکە مافی خۆی پێ بدرێ لە خەرجی و بژێوی ژیان و، جل و بەرگ و پۆشاك، ئەمەیە ئەو دادپەروەرییەی کە خودا فەرزی کردووە، نەك دادپەروەر بوون لە خۆشەویستی نێو دڵ، چونکە ئەمەیان کەس توانای بەسەردا ناشكێ تا بتوانێ دەسەڵاتی بەسەردا بگێرێ .

وە هەندێ لە پیاوان کاتێك لە خێزانێك زیاتریان هەبێ، ئەوا زیاتر بەلای یەکێکیاندا لادەدان و ئەوانی تریش پشت گوێ دەخەن، شوێنی نوستنیان زیاتر لەلای یەکێکیانە یان خەرجی و بژێوی بۆ یەکێکیان زیاترە و ئەوانی تر واز لێ دێنن، ئا ئەمانە هەمووی حەرامن و، ئەم جۆرە کەسانە لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێن بۆ مەحشەر بەحاڵ و شێوازێك کە وەسفەکەی لە«حەدیث»ەکەی «أبوهريرة»دا هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دەفەرموێ:

**« مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشقُّهُ مَائِلٌ».**

**واتە:«هەرکەسێك دوو خێزانی هەبێ و مەیلی بۆ یەکێکیان زیاتر بێ لەوی تر، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دێت لایەکی خوارە و لاسەنگە»**[1].

(١)رواه أبو داود ٢/٦٠١ وهو في صحيح الجامع ٦٤٩١

## بەتەنها مانەوە لەگەڵ نامەحرەمدا

شـەيتان سـووره لەسـەر فريـودانو لـە خـشتە بردنـی خـەڵكیو تـوش كردنيـان بـەتاوانو تێوەگلانـدنيان بـە حـەرام، جـا لەبـەر ئـەوە خـوای گـەورە وريـای كردوينەتەوەو دەفەرمووێ :-

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ ﴾ النور: ٢١

**واتـە: « ئـەی ئەوانـە وا باوەڕتـان هێنـاوە بـەدوای نەخـشەو هـەنگاوەكانی شـەيتان دا مـەڕۆن، چـونكە شـەيتان هەميـشە فـەرمان دەكـات بـەكاری زۆر خراپ لە زيناو تاوان ».**

وە شـەيتان بـەناو دەمـارو موولوەكـانی خـوێنی مرۆڤـدا هاتوچـۆدەكات بـۆ ئـەوەی توشـی تـاوانو خراپـەی بكـات، جـا يـەكێك لـەو ڕێگـاو ڕێـچكانەی كـە شـەيتان بـە هۆيـەوە مـرۆڤ دەخاتـە تاوانـەوەو لـە داوێـن پيـسی دا دەيگـەوزێنیّ، بريتيەلـە بـە تەنهامانەوە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا .

جـا لەبـەر ئـەوە شـەريعەتی ئيـسلام ئـەم ڕێگايەشـی داخـستووەو بـە تەنهامانەوەی لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا حەرامو قەدەغەكردووە.

وەكو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ :

« لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ».

**واتە: « هیچ پیاوئافرەتێك بە تەنها كۆنابنەوە ئیلا شەیتان سێ یەمیانە»**[١]

وە فەرموویەتی:

**« لَا يَدْخُلَنَّ رَجُلٌ بَعْدَ يَوْمِي هَذَا عَلَى مُغِيبَةٍ إِلَّا وَمَعَهُ رَجُلٌ أَوْ اثْنَانِ».**

**واتە: « لە ئەمڕۆ بەدواوە، با هیچ پیاوێك نەچێتە ماڵی ئافرەتێكەوە كە پیاوەكەی لە ماڵ نەبێ، مەگەر كەسێكی تر یان دوانی لەگەڵ بێ »**[٢]

جا بۆیە دروست نی یە بۆ پیاو بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێ نامەحرەمدا بێنێتەوە لە ماڵێكدا، یان لە ژورێكدا، یان لە سەیارەیەكدا، وەكو مانەوەی لەگەڵ برا ژنی یان خزمەتكاری، یان تەنهابونەوەی نەخۆشێكی ئافرەت لەگەڵ دكتۆرێكدا.

زۆركەس كەم تەرخەمن لەم كارەداو بەئاسانو سادە تەماشای دەكەنو گوێی پێ نادەن، ئەویش لەبەر ئەوەی سیقەو متمانەی بە خۆی هەیە یان بە بەرامبەرەكەی، كەچی تاوانو خراپەی زۆری لێ دەكەوێتەوەو دەكەونە ناولێشاوی داوێن پیسی و پێشەكیەكانیەوە

مەینەتیو دەردەسەری زیاتر لە وەدایە كە دەبێتە هۆی تێكەڵو پێكەڵ بوونی نەژادو ڕەچەڵەكی یەكترو پەیدابوونی منداڵی حەرام و ناشەرعی.

---

(١)رواه الترمذي ٤٧٤/٣ انظر مشكاة المصابيح ٣١١٨

(٢)رواه مسلم ١٧١١/٤

## تەوقەكردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم

یەكێك لەو داب‌و نەریتە كۆمەڵایەتیانەی كە بێ شەرعیەو سنوری شەریعەتی خودای تێدا دەشكێنرێ تەوقەكردنە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم، خەڵكی ئەم داب‌و نەریتە ناڕەواو پوچانەی كە خوویان پێوەگرتوو بە بەرزترو باشتری دادەنێن لە حكم و شەریعەتی خوا، بۆیە ئامادەن شەرعی خوا ببەزێن بەڵام ئامادەنین كە داب‌و نەریتی كۆمەڵگا بشكێنن.

تەنانەت ئەگەر یەكێك لەوانە بدوێنی‌و حوكمی شەرعی بۆ باس بكەی دەربارەی تەوقەكردن‌و بەڵگەی بۆ بهێنیتەوەو بۆی بسەلمێنی كە تەوقەكردن بێ شەرعیەو تاوان‌و حەرام‌و سەرپێچیە،ئەوا بە دواكەوتوو ووشك و دڵ پیس تاوانبارت دەكات و بوهتان‌و درۆو دەلەسەت بۆ هەڵدەبەستێ .

تەنانەت لە كۆمەڵگەدا وای لێ هاتووە تەوقەكردن لەگەڵ پورزاو ئامۆزاو خاڵۆزاو براژن‌و مامۆژن‌و خاڵۆژن سادەترو ئاسان تر بووە لە خواردنەوەی ئاو.

خۆ ئەگەر بە چاوی دڵ تەماشای ترسناكی‌و سامناكی ئەم تاوانەیان بكردایە لە شەرع دا، ئەوا هەرگیز كاری وایان نەدەكردو توخنی نەدەكەوتن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

« لأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيَطٍ من حَدِيدٍ خَيْرٌ له من أَنْ يَمَسَّ امْرَأَةً لا تَحِلُّ له».

**واتە: « هەریەك لە ئێوە ئەگەر نەقیزەیەکی ئاسن دابکوترێ بەسەریدا زۆر باشترە بۆی لەوەی دەستی بەرئافرەتێك بکەوێت کە بۆی حەلاڵ نەبێ »[١].**

وە گومـانی تێـدانی یـە تەوقـەکردن لەگـەڵ ئـافرەتی نامـەحرەم زینـای دەسـتە . هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ :

**« الْعَيْنَانِ تَزْنِيَانِ ، وَالْيَدَانِ تَزْنِيَانِ ، وَالرِّجْلَانِ تَزْنِيَانِ ، وَالْفَرْجُ يَزْنِي».**

**واتە: « هەردوو چاو زینادەکەن کە تێڕوانینی حەرامە، وە دەستەکانیش زینادەکەن کە دەست بردنو تەوقەکردنە، وە قاچەکایش زینادەکەن کە هەنگاو نانە بۆی، وە عەورەتیش زینادەکات»[٢].**

هەندێ ئەوە دەکەنـە بیـانوو دەڵـێن دڵمـان پاکـە، بـەلاَم ئایـا هـیچ دڵێـك هەیـە لـە دڵی پێغەمبەرﷺ پاکترو پیرۆزتربوو بێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەفەرمووێ :

**« إِنِّي لَا أُصَافِحُ النِّسَاءَ». واتە: « من تەوقە لەگەڵ ئافرەتدا ناکەم »[٣]**

**وە هەروەها دەفەمووێ :-**

**« إني لا أمـــس أيـــدي النـــساء» واتـە: « مـن دەسـت لـە دەسـتی ئـافرەت نادەم»[٤].**

**وە عائشە دەفەرموێ:**

**« وَلَا وَاللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ غَيْرَ أَنَّهُ يُبَايِعُهُنَّ بِالْكَلَامِ».**

---

(١)رواه الطبراني ٢١٢/٢٠ وهو في صحيح الجامع ٤٩٢١

(٢)رواه الإمام أحمد ٤١٢/١ وهو في صحيح الجامع ٤١٢٦

(٣)رواه الإمام أحمد ٣٥٧/٦ وهو في صحيح الجامع ٢٥٠٩

(٤)رواه الطبراني في الكبير ٣٤٢/٢٤ وهو في صحيح الجامع ٧٠٥٤ وانظر الإصابة ٣٥٤/٤ ط.٣٤٢.

واتــە: « نـەخێر سـوێند بـەخوا هـەرگیز دەسـتی پێغەمبـەر ﷺ نەكـەوتووە بـە دەسـتی هـیچ ئافرەتێك،بـەڵام بەیعـەتی لـێ وەردەگـرتن تـەنها بـە قـسەوگفتوگۆ »[1]

بۆیـە ئـەو پیاوانـەی كـە خێزانـی دینـداری خۆیـان دەترسـێننو هەڕشـە وگوڕەشـەی تـەڵاقیان لـێ دەكـەن بـە بیـانوی ئـەوەی كـە لەگـەڵ بـرای مێردەكانیـان تەوقەناكـەن، با لە خوا بترسنو خێزانیان بەرەو تاوانو سەرپێچی پەلكێش نەكەن.

وە پێویـــستە ئـــەوەش بزانـــدرێ تەوقـــەكردنی نێـــوان پیـــاو ئـــافرەتی نامـــەحرەم حەرامــە ئەگــەر بەربەســتو پــەردەش لــە نێــوان دەســتان دا هــەبێ، بۆیــە دانــانی بەربەســت و پەردەیــەك یــان تەوقــەكردن لەســەر جلــەوە بــێ ســودەو هــیچ لــە مەسەلەكە ناگۆڕێو لە هەردوو حاڵەتەكەدا هەر حەرامە

## خۆ بۆنخۆش كردنی ئافرەت لە كاتی لەماڵ دەرچونیو تێپەڕینی بەلای پیاواندا

ئەمـــەش یەكێكـــە لـــەو كـــارو كـــردارە بلاوانـــەی ســـەردەمی ئێمـــە كـــە پێغەمبــەرﷺ زۆر بــە تونــدی ووریــای كردوینەتــەوە لێــیو بــۆ ئــەوەی تــوخنی نەكەوین.

وەكو دەفەرمووێ

« أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ ثُمَّ مَرَّتْ عَلَى الْقَوْمِ لِيَجِدُوا رِيحَهَا فَهِي زَانِيَةٌ».

---

(١)رواه مسلم ١٤٨٩/٣

**واتــە: «هــەر ئافرەتێــك خــۆی بــۆن خــۆش بكــات، پاشــان تێپــەڕبێ بــەلای كۆمــەڵێك دا بــۆ ئــەوەی هەســت بــە بۆنەكــەی بكــەن، ئــەوا ئــەو ئافرەتــە زیناكــارو داوێن پیسە»**(١).

بــێ ئاگــایی‌و خۆگێــل كــردن وای لــە هەنــدێ ئافرەتــان كــردووە كــە گــوێ بــەم كارەنــەدەن‌و بەســادەو ئاســان تەماشــای بكــەن، لــە نــاو پاســدا بــێ یــان لــە بــازاڕو شوێنی قەرەباڵغی دابێ، یان لە قوتابخانە و فێرگەكاندا بێ .

نــەك هەرئەوەنــدە بــەڵكو شــەریعەتی ئیــسلام ترســناكی خــۆ بۆنخــۆش كردنــی ئــافرەتی زۆر بــە تونــدی گرتــووە، بۆیــە ئــافرەتێ ئەگــەر لەماڵــدا بــۆنی خۆشــی لــە خــۆی دا بــوو ویــستی لــە مــاڵ دەرچــێ پێویــستە خــۆی بــشوات، تــاوەكو ئــەو بۆنــەی پێــوە نــەمێنێ، وەك چــۆن بــۆ لــەش گرانــی خــۆی دەشــوات، تەنانــەت گــەر دەرچونەكەیشی بۆ مزگەوت بێ .

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ :

**« أَيُّمَا امْرَأَةٍ تَطَيَّبَتْ ثُمَّ خَرَجَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ لِيُوجَدَ رِيحُهَا لَمْ يُقْبَلْ مِنْهَا صَلَاةٌ حَتَّى تَغْتَسِلَ اغْتِسَالَهَا مِنْ الْجَنَابَةِ».**

**واتــە: « هــەركات ئــافرەت خــۆی بــۆن خــۆش بكــات‌و دەربــچێ بــۆ مزگــەوت بــۆ ئــەوەی بــۆن كــرێ، نوێژەكــەی لــێ وەرنــاگیرێ، هــەتاوەكو خــۆی نەشــوات، وەكــو خۆشۆردنی بۆ لەش گرانی»**(٢).

ســكالای خۆمــان دەبەینــەوە بــۆلای خــودا لــە دەســت ئــەو هــەموو بۆنــەی كــە لــە كــاتی ئاهــەنگ گێــڕان‌و بــوك گواســتەوە دا بــەكاردەهێنرێ، وە لــە دەســت

(١)رواه الإمام أحمد ٤/٤١٨ انظر صحيح الجامع ١٠٥

(٢)رواه الإمام أحمد ٢/٤٤٤ وانظر صحيح الجامع ٢٧٠٣

بەکارهێنانی ئەو هەموو بۆنە تیژوکاریگەرانەی کە هەستی پێ دەکرێ لە ئافرەتانەوە، لە بازاڕو ناو ئوتۆمبێل و شوێنەگشتیەکان و تەنانەت لە مزگەوتداو لە شەوانی ڕەمەزاندا .

لە خودا داوادەکەین کە سزامان نەدات، وە پیاوانو ئافرەتانی چاك دووچاری تۆڵەی خۆی نەکات بەهۆی کارو ڕەفتاری پیاو ئافرەتانی بەدڕەوشت و ئەتوار خراپ. وە هەمووومان ڕێنموونی بکات بۆ ڕێگای ڕاستو ڕێگای حەلاڵمان نیشان بدات.

## سەفەرکردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم

«عبـدالله»ی کوڕی«عباس» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

«لَا تُسَافِرْ الْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ».

**واتە: « نابێ ئافرەت سەفەربکات مەگەر لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا بێ »**[1].

ئەمەش هەموو سەفەروگەشتێك دەگرێتەوە تەنانەت سەفەری حەج کردنیش.

سەفەرکردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم هۆکارە بۆ ئالودەبونو لە چالکەوتنی بە داوی کەسانی دڵپیسو خراپەکارو، ئەو ئافرەتەش دەبێتە نیشانەو جێگای تێڕوانینی ئەو جۆرەکەسانە، چونکە ئافرەت خۆی بۆ خۆی لاوازوکەم توانایە،

(١)صحيح البخاري (١٧٢٩)

کەمترین حاڵەتێك کە دووچاری بێت ئەوەیە شەرەف و ناموسەکەی دەکەوێتە مەترسی یەوە.

بەهەمان شێوە حەرامە ئافرەت بەبێ مەحرەم سواری فڕۆکە ببێ، هەرچەندە ئەگەر مەحرەمێکیشی لەگەڵ بێ تا سواری فڕۆکەکە دەبێ و لەو جێ یەش پێ ی دەگات مەحرەمێکی تر چاوەڕێی بکات هەر حەرامە مادام لەناو فڕۆکەکە مەحرەمی لەگەڵدا نەبێ .

ئەبێ بزانرێ کێی لەگەڵ دا سواربووەو لە پاڵی کێ دا دانیشتوە، خۆ ئەگەر ناتەواوی و خەلەلێك لە فڕۆکەکەدا دروست بێ، ئەوا لە فڕۆکە خانەیەکی تر دەنیشێتەوە، یان لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا دوا دەکەوێ، کاتی یەکتربینینەکە نارێکی تێدەکەوێ، ئەوجا حال چی دەبێ ؟! چیرۆك و بەسەرهاتی سامناك و دڵتەزێنی لەو جۆرە زۆرن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مەحرەمەی کە شەرع دیاری کردووە، پێویستە چوار مەرجی تێدابێ ئەگەر نا سەفەرکردن لەگەڵی دروست نی یە، دەبێ موسڵمانێکی بالغ ی عاقڵی کوڕ بێت .

وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

« لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا يَكُونُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا إِلَّا وَمَعَهَا أَبُوهَا أَوْ ابْنُهَا أَوْ زَوْجُهَا أَوْ أَخُوهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا».

**واتە: « دروست نی یە بۆ ئافرەتێك كە باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوای هەبێ دەرچێ بۆ سەفەرێك كە سێ ڕۆژ یان زیاتری پێ بچێ، مەگەر باوكی یان كوڕی یان برای یان مەحرەمێكی لەگەڵ دا بێ»[١].**

## تێڕوانینی ئافرەتی نامەحرەم

خوای گەورە دەفەرمووێ :

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ النور: ٣٠

**واتە: « ئەی پێغەمبەر ﷺ بە پیاوانی باوەڕدا بفەرموو : چاوەكانیان داخەن لە ئاست ئافرەتانی نامەحرەم دا بۆیان نەڕاونن، وە داوێن و عەورەتی خۆیان بپارێزن لەحەرام، بێ گومان ئەوە باشترو پاكترە بۆیان، وەخوداش ئاگادارە بەهەموو ئەوكارانەی كە دەیكەن».**

وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

**« فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ» واتە: « زینای چاو تێڕوانینە »[٢].**

واتە تێڕوانین بۆ ئەو شتانەی كە خواحەرامی كردووە لێ ی بڕوانێت .

(١)رواه مسلم ٢/٩٧٧

(٢)رواه البخاري انظر فتح الباري ١١/٢٦

بەلاَم تێروانین ئەگەر بۆ پێویستیەکی شەرعی بێت وەکو تێروانین لەکاتی خوازبێنی کردندا، یان تێڕوانینی دکتۆرێك بۆ نەخۆش ....ئەوەی جیاوازەو لەم حاڵەتە جیادەکرێتەوە .

هەروەها لەسەر ئافرەتیش حەرامە بڕوانێ بۆ پیاوی نامەحرەم ، ڕوانینێك کەجێگای فیتنە بێو مەترسی بێ.

وەکوخوای گەورە دەفەرمووێ :

﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ النور: ٣١

واتە: « ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەئافرەتانی بڕوادار بڵێ: باچاویان داخەن لەئاست تێڕوانینیان بۆ پیاوانی نامەحرەمو داوێنی خۆیان بپارێزن لە حەرام ».

هەروەها حەرامە تێڕوانین بەشەهوەتەوە بۆ کەسانی بێ مووی جوان، وەحەرامە پیاو لە عەورەتو شەرمینگای پیاو بڕوانێ ، وە ئافرەتیش لەعەورەت و شەرمینگای ئافرەت بڕوانێ .

وەهەروەها عەورەتو شەرمینگایەك کە تێڕوانین بۆی دروست نەبێ ، دەست لێدانیشی دروست نیە.

وە لەو گاڵتەو سوکایەتی و فڕوفێڵانەی کە شەیتان بە عەقڵی هەندێ کەسی دەکاتو هەندێ کەسی پێوە گیرداوە ئەوەیە کە هەندێ کەس لە وێنەو ڕەسمی گۆڤارو فلیمەکاندەڕوانن‌و تەماشای دەکەن بەبیانوی ئەوەی ئەمانە حەقیقی نین‌و تەنها ڕەسم‌و ێنەن، ئەم جۆرە بڕوبیانو بەهانانە تەنها چاوبەستەی شەیتانەو بەس، ئەگەر نا شتێکی ڕون وئاشکراو بێ چەندوچوونو

حاشاهەڵنەگرە کە ئەم وێنەو ڕەسمانە سەرچاوەن بۆ خراپەو بێ ئابڕوویی‌و کاری ناقۆڵاو بەدڕەوشتی‌و وروژاندنی شەهوەت‌و ئارەزووبازی.

## بێ دەنگ بوونی پیاو لەئاست داوێن پیسی خێزان و منداڵی

«عبداللە»ی کوڕی«عمر» لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

**« ثَلَاثَةٌ قَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ الْجَنَّةَ مُدْمِنُ الْخَمْرِ وَالْعَاقُّ وَالدَّيُّوثُ الَّذِي يُقِرُّ فِي أَهْلِهِ الْخَبَثَ».**

**واتە: « سێ کۆمەڵ خەڵك خودا بەهەشتی لەسەر حەرام کردوون ، ئەوکەسەی لەسەرئارەق خواردنەوە بەردەوام بێ ، وە ئەوەی ئازاردەری دایك وباوکی بێ ، وە گەوادێك کە بێ دەنگ بێ لە داوێن پیسی خێزان ومنداڵی»**(1).

لەشێوەکانی ((الديوث))ی ئەم سەردەمە ئەوەیە:

چاوپۆشی کردن‌و بێ دەنگ بوون لە ئاست کچ وئافرەت لە ماڵەوە کەپەیوەندی دەکەن بە پیاوی بێگانەوەو گفتوگۆ دەکەن بە ناوی خۆشەویستی‌و دڵداری‌و عیشق بازیەوە .

(1)رواه الإمام أحمد ٦٩/٢ وهو في صحيح الجامع ٣٠٤٧ .

وەهـەروەها ڕازی بـوونو قـەبوڵ كردنـی مانـەوەی ئافرەتێـك بەتـەنها لـە ماڵـەوە لەگـەڵ پیـاوێكی بێگانــە، وە هــەروەها بـەجێ هێـشتنی ئـافرەت بەتـەنها لەگـەڵ بێگانەیەك سواری سەیارە ببێ، وەكو تەنها بونی لەگەڵ شۆفێر.

وە هـەروەها ڕازی بـێ كـە خێـزانو منـداڵی بـەبێ پۆشـاكی شـەرعی لەماڵـەوە دەرچـن، بـەوەش ڕێگـەی خراپـەی بۆیـان كردۆتـەوەو دەرگـای بەدڕەوشـتی بـۆ خـستونەتە سەرپـشت ، هـەروەها هێنانـە ماڵـەوەی ئـەو فلـیم وگۆڤارانـەی كـە خراپەو بەدڕەوشتیو بێ ئابڕوی تێدا بڵاو دەكرێتەوە.ئەمانە نمونەن لە دەیوسی.

## تەزویركردنی نەسەبی منداڵو باوك

بـە پێـی شـەرع دروسـت نـی یـە بـۆ هـیچ موسـڵمانێك ڕەچـەڵەكو نەسـەبێ بداتـە لای هـیچ كەسـێك جگـە لـە بـاوكی خـۆی .یـان خـۆی بـە قـەومو گـەلێك بناسـێنیو لەوان نەبێ .

جـا هەنـدێ كـەس ئـەم كـارە دەكـەن بـۆ مەبەسـتو مـەرامێكی مـادی، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش نەسـەبو ڕەچـەڵەكێكی سـاختەو تـەزویر دەسـەلمێنێ لـە كاغـەزو وەرەقەیەكی یاساییدا .

هەنـدێ كـەس ئـەم كـارە دەكـەن زۆر جـار لـە ڕقـی باوكیـان، چـونكە بـە منـداڵی وازی لێ هێناوەو دەری كردووە.

هـەموو ئەمانـە حـەرامو قەدەغـەكراون، وە ئـەم كـارە خراپـەو بـەڵای گـەورەو گرانـی لێدەكەوێتـەوە لـە زۆر بـواری جۆراوجـۆردا، وەكـو مەحرەمـەكان و نیكـاح و میرات و زۆر شتی تریش .

«سعد»و«أبوبكره» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێرنەوە كە فەرموویەتی:

« مَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ ».

**واتە: « هەركەس بانگەشەی كوڕێتی خۆی بكات بۆكەسێكی تر جگە لە باوكی خۆی نەسەبی خۆی بداتە لای‌و بزانێ ئەوە باوكی نی یە، ئەوا بەهەشتی لەسەر حەرامە»[1].**

لەشەریعەتی پیرۆزی ئیسلام دا هەر شتێك كەمایەی گاڵتەو لاقرتی كردن بێ بە ڕەچەڵەك و نەسەبی خەڵكی حەرامە، وە یان تەزویر و ساختەكردنی بێ هەر حەرامە.

بۆیە هەندێ كەس لەم بوارەدا دووچاری هەڵەی زەق دێن‌و ووشەو دەربڕنێك لە زاریان دەردەچێ كە بەرەو ئەم تاوانە پەلكێشیان دەكات، بۆ نمونە كاتێك پیاو لەگەڵ خێزانەكەیدا بە شەڕدێت‌و دەمەقاڵە دروست دەبێ زیادەڕەوی دەكات لە بەرامبەر خێزانی‌و بەداوێن پیس تاوان باری دەكات‌و حاشای خۆی لەمنداڵەكانی دەكات‌و بەمنداڵی خۆی نازانێ بەبێ ئەوەی بەڵگەیەكی ڕوون وناشكرای بەدەستەوە بێ ، لە كاتێكدا ئەو منداڵانە بەهۆی سەرجێ ی كردنی ئەم لەگەڵ خێزانی دروست بوون.

وە هەندێ ئافرەتانیش خیانەت‌و ناپاكی لە مێردەكانیان دەكەن‌و لەرێگەی كاری ناشەرعی‌و داوێن پیسییەوە دوگیان دەبن‌و ، منداڵ و وەچەی نارەسەن تێكەڵ بەرەچەڵەكی پیاوەكەی دەكات كە لە پیاوەكەی نی یە .

وە هەڕەشەی زۆرتوند وگران لەسەر ئەم كارانە هاتووە لە شەریعەتدا :

---

(١)رواه البخاري انظر فتح الباري ٤٥/٨.

«أبوهريرە» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:

« أَيُّمَا امْرَأَة أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ مَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ فَلَيْسَتْ مِنْ اللَّهِ فِي شَيْءٍ وَلَنْ يُدْخِلَهَا اللَّهُ جَنَّتَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ احْتَجَبَ اللَّهُ مِنْهُ وَفَضَحَهُ عَلَى رُءُوسِ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ».

واتە: «هەر ئافرەتێك منداڵێك بخاتە ناو بنەماڵەیەكەوە كە لە مێردی خۆی نەبێ، ئەوا ئەو ئافرەتە لەلای خودا بەشی نی یەو خوداش نایخاتە بەهەشتەوە، وە هەر پیاوێكیش نكوڵی منداڵی خۆی بكاتو حاشای لێ بكاتو بزانێ منداڵی خۆیەتی، ئەوا خودا ڕەحمو بەزیی خۆی لێ دەبڕیو شەرمەزاریشی دەكات لە پێش چاوی سەرجەم خەڵكان دا»[1].

## سوو خواردن ((ریبا))

خوای پەروەردگار لە قورئاندا جەنگو شەڕكردنی خۆی لەگەڵ هیچ كەسو تاقمێك ڕانەگەیاندوە تەنها سوخۆرەكان نەبێ .

وەكو دەفەرمووێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقرة: ٢٧٨ – ٢٧٩

(١) رواه أبو داود ٢/٦٩٥ انظر مشكاة المصابيح ٣٣١٦.

**واتە: «ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوابترسن‌و دەست هەڵگرن لەو ڕیباو سووەی کە ماوتانە لەسەر خەڵکی ئەگەر ئیمان‌و باوەڕدارن، خۆ ئەگەر دەست هەڵنەگرن‌و وازنەهێنن لە سووخۆری، ئەوا جەنگێکی گەورە ڕابگەیەنن لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی».**

ئەم ئایەتە بەسە بۆ دەرخستنی خراپی‌و نالەباری ئەم تاوانە لەلای خوای بەرزو بێ هاوتا .

ئەگەر تەماشایەك بكرێ لەسەر ئاستی تاك‌و دەوڵەتان، ئەوا وێرانكاری‌و فەوتان‌و لەناوچوونێكی زۆر دەبینرێ لە پشت مامەڵەكردن بە ڕیباوە، هەر لەمایە پوچ بوون‌و لەدەست دانی ماڵ‌و پارەو بێ بازاڕی‌و بێ توانابوون لە دانەوەی قەرزو إفلیج بوونی باری ئابووری‌و بەرزبونەوەی بێ كاری تادەگاتە هەرەس هێنانی زۆربەی كۆمپانیاو كارگەكان.. وە هەروەها لە ئەنجامی ڕیباو بلاوبونەوەی سوخۆری ئیشكەرو كرێكار وای لێ هاتوە ڕۆژانە هەوڵبدات‌و هەڵپە بكات بۆ پڕكردنەوەی ئەو قەرزانەی كە بە هۆی ڕیباوە هاتۆتە سەری‌و تەواو بوونی بۆنیە، ئا ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی چینایەتی لەناو كۆمەڵگەدا، چونكە ڕیبا هۆكاری سەرەكیە بۆ كۆبوونەوەی ماڵ‌و سەروەت‌و سامانی زۆر لە دەستی ڕێژەیەكی كەمی خەڵكداو چینەكانی تریش هەژارو نەدار دەمێننەوە، پێ دەچێ ئەمە دیمەنێكی ئەو شەڕو جەنگە بێ كە خودا بەڵێنی داوە بەرامبەر بەوكەسانەی مامەڵە بەڕیباوە دەكەن .

جا هەركەسێك بەشداری بكات لە مامەڵەكردن بە ڕیباوە، ئەوا لەعنەتی لێ كراوە لەسەر زمانی پێغەمبەرﷺ ، ئیتر جیاوازی نی یە ئەوكەسە خۆی لایەنی سەرەكیە لە خواردنی ڕیباكە، یان یارمەتی دەرێ ، یان تكاكاربێ.

«جابر»ی کوڕی«عبدالله» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

**« لَعَنَ رسول اللّهِ صلى الله عليه وسلم آكِلَ الرِّبَا وموكله وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ وقال هُمْ سَوَاءٌ».**

**واتە: « پێغەمبەرﷺ لەعنەتی کردوە لە ڕیباخۆر، لە وەی کە دەیداتێ، لە نوسەرەکەی، لە شاهیدەکانی، وە فەرمووی هەر هەموویان لە تاواندا وەك یەکن»[1].**

کەوابوو دروست نی یە ئیش کردن لە نوسینەوەی کاری ڕیبا، وە گونجاندن و ڕێکخستنو قسە تێدا کردنیو، وەرگرتن و بردنەوەیو، هەڵگرتنی وەکوسپاردەو، پاراستنی، ئەمانە هەمووی حەرامن .

بەشێوەیەکی گشتی بەشداری کردن لەکاری ڕیباو هاوکاری کردن تییدا بەهەر شێوەیەك حەرامەو قەدەغەکراوە.

وەپێغەمبەرﷺ سووربووە لەسەر ڕونکردنەوەی گەندەڵیو ناقۆڵایی ئەم تاوانە گەورەیە هەروەك «عبدالله»ی کوڕی«مسعود» لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

**« اَلرِّبَا ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ بَابًا أَيْسَرُهَا مِثْلُ أَنْ يَنْكِحَ اَلرَّجُلُ أُمَّهُ، وَإِنَّ أَرْبَى اَلرِّبَا عِرْضُ اَلرَّجُلِ اَلْمُسْلِمِ».**

**واتە: « ڕیبا حەفتاو سێ بەشە تاوانی ئاسانترینیان وەکو ئەوەیە پیاوێك دایکی خۆی مارەکات، وە سوکترینی سووەکان ناموسی پیاوی موسڵمانە»[2].**

---

(١)رواه مسلم ١٢١٩/٣.

(٢)رواه الحاكم في المستدرك /٣٧ وهو في صحيح الجامع ٣٥٣٣

وەهـەروەها «عبـــدالله»ی کـوڕی«حنظلـــة» لـە پێغەمبـەرەوەﷺ دەیگێڕێتـەوە کە فەرموویەتی:

« دِرْهَمٌ رِبًا يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ وَهُوَ يَعْلَمُ أَشَدُّ مِنْ سِتَّةٍ وَثَلَاثِينَ زَنْيَةً».

**واتـــە: « درهـــەمێك ڕیبـــا گـــەر پیاوێـــك بیخـــوات و بزانـــێ ڕیبایـــە ئـــەوا لەشەست و سێ زینا قورسترەو تاوانترە»[1]**

وە ڕیبـا تـاوانێکی گـشتیەو تایبەتمەنـدنی یـە بـە حـاڵی فـەقیری و دەوڵەمەنـدی یـەوە، هـەروەك هەنـدێ واگومـان دەبـەن، بـەڵکو گـشتیەو هـەموو حاڵـەتێك و هـەموو کەسـێك دەگرێتـەوە، چـەندەها دەوڵەمەنـدو بازرگـانی گـەورە مایـە پـوچ دەرچوون بەهۆی ڕیباوە، واقعیش بەڵگەیە بۆ ئەمە

کـەمترین بێخێریـەك کـە لـە ڕیبـاوە سەرچـاوە بگـرێ ئەوەیـە کـە فـەڕو بەرەکـەت لە ماڵیدا هەڵدەگرێ ونایهێڵێ هەرچەندە لە ژمارەو پێوانەشدا ماڵەکە زۆر بێ.

هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

« الرِّبَا وَإِنْ كَثُرَ فَإِنَّ عَاقِبَتَهُ تَصِيرُ إِلَى قُلٍّ ».

**واتـــە: « ڕیبـــاو ســـوو هەرچـــەندە لەســـەرەتاوە مـــاڵ زۆر دەکـــات، بـــەڵام سەرئەنجامەکەی هەر بەرەو کەمی ولەناوچون دەڕوات »[2].**

بەهـەمان شـێوە ڕیبـاو سـوو تایبـەت مەنـد نـی یـە بـە بـەرزو نزمـی یـان کـەم و زۆری ڕێژەکەیەوە، هەر هەمووی حەرامەو قەدەغەکراوە

---

(١)رواه الإمام أحمد ٥/٢٢٥ انظر صحيح الجامع ٣٣٧٥

(٢)رواه الحاكم ٢/٣٧ وهو في صحيح الجامع ٣٥٤٢

پیاوی سوو خۆر لە ڕۆژی قیامەتدا وەكو مرۆڤی پەرپەتی‌و شێتی لێ دێ‌و، كاتێك لە گۆڕ دەردێن‌و زیندوو دەكرێنەوەو ڕاست دەبنەوە دەڵێی شەیتان دەستی لێ وەشاندوون‌و توشی شێتی‌و پەركەمی دەبن.

لەگەڵ ناشرینی‌و نابەجێیی‌و خراپی ئەم تاوانەدا هێشتا خودای گەورە ڕێگای بە تەوبەو پەشیمانی داوە، خەبەری داوە كە تەوبەی لێ بكرێ‌و وازی لێ بهێنرێ‌و چۆنێتی پەشیمان بونەوەكەشی ڕونكردۆتەوە

خوای گەورە بەسووخۆرەكان دەفەرمووێ :-

﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة: ٢٧

**واتە: « ئەگەر دەست لەسوو خۆری هەڵگرن‌و پەشیمان بنەوە لێی، ئەوا سەرمایەكانی خۆتان بسێننەوە بەبێ سوو، ئیتر نە ئێوە لە قەرزارەكان ستەم كەن، نە ئەوانیش لە ئێوە ستەم بكەن ».**

وە پێویستە لەسەر مرۆڤی باوەڕدار خۆی لەم تاوانە گەورەیە بپارێزێ‌و لێی ڕاكات‌و ڕوی تێ نەكات‌و، هەست بەخراپی‌و نابەجێیی ئەم تاوانە بكات.

وە تەنانەت ئەوكەسانەش كە ماڵ‌و پارەیان لەبانقەكانی سوودا دادەنێن لە بەرناچاری‌و لە ترسی لەناوچوون‌و دزینی ماڵەكەیان پێویستە لەسەریان هەست بكەن كە ئەمە لەبەر ناچاری‌و بێ دەرەتانیەو، حاڵ وباریان وەكو كەسێك وایە كە لە برسێتی‌و ناچاری دا گۆشتی مردارەوەبوو بخوات، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە داوای لێ خۆش بوون لە خوا بكەن‌و هەوڵی بەدیلێك بدەن‌و جێگاو شوێنێكی تر بدۆزنەوە گەر بكرێ

وە دروست نی یە بۆیان داوای زیادەی سووەکە بکەنەوە لە بانقەکان، تەنانەت ئەگەر ڕیباوسوو چووە سەر حساباتو پارەکەیان، پێویستە خۆیانی لیٚ ڕزگار بکەنو لەکۆڵی خۆیانی بکەنەوە بەڕێگاو شێوازێکی دروست، نەك بیکاتە خێرو صەدەقە، چونکە خودا پاکەو خێرو صەدەقەیەکیش گەر لە ماڵی پاکەوە دەرنەچیٚ وەری ناگریٚ و قەبوڵی ناکات.

وە هەروەها بە هیچ شێوەیەك دروست نی یە ئەو زیادەیەی چۆتە سەرپارەکەیان بۆ خۆیان بەکاری بهێننو لیٚ ی سوود مەندبن نە بۆ خواردن ، نە بۆخواردنەوە، نە بۆجل وبەرگ، نە بۆ سەیارە، نە بۆ خانوو، نە بۆخەرجی کیشانی ژن ومنداڵ و دایك وباوك، وەنەلەبری زەکات دەردەچیٚ، وە نەبۆ کرێی خانووو سەرانەی زەوی بەکاردەبریٚ ،وە نە بۆ پاراستنی گیانیش لە ستەمێك بەکاردیٚ . بۆیە پێویستە خۆی لیٚ قوتارکات ولەکۆڵی خۆی بکاتەوە لەترسی تۆڵەو تووڕەیی خودا.

## دەرنەخستنی عەیب وناتەواوی کەل وپەلی فرۆشراوو شاردنەوەی لەکاتی فرۆشتندا

پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای خواردنێکی وشکدا، دەستی کرد بەناو خواردنەکەدا پەنجەکانی بەر تەڕی کەوتن ،پێغەمبەرﷺ فەرمووی :-

« **يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ مَا هَذَا؟**». واتە: « **فرۆشیار ئەمەچی یە ؟**»

وتی باران بەری کەوتووەو تەڕی کردوە .

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

